### ج- بەکارهێنانی دەستەواژەی گونجاو

ڕەخنەی بنیاتنەرو بابەتیانە ئەو ڕەخنەیەیە کە ڕەخنەگر تیایدا بۆ پێکانی ئامانجەکەی دەستەواژەی گونجاو بەکاردەهێنێتو بەبێی تواناش لە دەستەواژەی توندوتیژ دوور بکەوێتەوەو لەپەنای ڕەخنەوە هەستی کەس بریندار نەکاتو تیروتوانجیان تێنەگرێت.

جا بێوەری دەستەواژەی گونجاو بریتییە لە پێویستێتی ئەم دەستەواژەیە بۆ گوزارشتکردن لە بیروڕای نووسەرەکەی بۆ هێنانەدی ئەو واتایەی کە لە نووسینەکەیدا مەبەستیەتی[101].

جێی سەرنجە، "گونجاوێتی دەستەواژە" مەسەلەیەکی ڕێژەییەو بەستراوەتەوە بە جۆرو بارودۆخی ئەو ڕووداوەی کە ڕەخنەکەی ئاراستە دەگرێتو بەبێی ئەو باروودۆخە گونجاوێتی نێوان دەستەواژەو ئەو بیروڕایەی کە تەعلیقی لێدەدرێ هەڵدەسەنگێندرێت[102].

دادگای فەرەنسی لە ساڵی ١٩٩٢ ئەو ڕۆژنامەنووسانەی لە تاوانی ئانەوتەشەری بەتاشکرا بەخشی بۆ ئەو ئانەوتەشەرانەی کە دابوویانەپاڵ سیاسەتمەدارێك گوایە: ((مرۆڤێکی هەڵپەرستەو بەپێی باروودۆخ بەرگی خۆی دەگۆڕێتو لەگەڵ خوێی خۆی دژوارەو هیچ نرخێك بۆ باوەڕە ڕاستەقینەکەی خۆی دانانێت)) دادگای ناوبراو دووپاتی کردۆتەوە کە ئەو دەستەواژانەی کە لەم وتاردا بەکارهاتوونە، سنووری مافی ڕۆژنامەنووسیان لە ڕەخنەگرتنی ڕەفتاری گشتیو بەرنامەی سیاسەتمەدار بەتایبەتی لە کاتی هەڵبژاردندا نەبەزاندووە[103].

---

١٠١ - طارق احمد فتحي سرور، الحماية الجنائية لأسرار الأفراد في مواجهة النشر، سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٥.

١٠٥ - لطيفة حميد محمد، جرائم النشر في التشريع العراقي، سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٥.

١٠٦ - لطيفة حميد محمد، جرائم النشر في التشريع العراقي، سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٥.

### د- دەبێ ڕەخنەگر نیازی پاکە بێت

بۆ ئەوەی، ڕەخنە، ڕەخنەیەکی ڕەوابێت و ڕێگای پێبدرێت، دەبێ ڕەخنەگر لە ڕەخنەکەیدا نیازی پاک بێت. ئەمەش بە بوونی ئەم دوو مەرجانەی خوارەوە دێتەدی:

#### ١- دەبێ ڕەخنەگر لە ڕەخنەکەیدا ئامانجی خزمەتکردنی بەرژەوەندی گشتی بێت

لەڕێگای ئەم مەرجەوە ئەو مەبەستە دێتەدی کە لە پێناویدا دان بە مافی ڕەخنەگرتن دراوە کە بریتییە لە خزمەتکردنی بەرژەوەندی گشتی لەڕێگای گوزارشتکردن لە بیروڕایەکی بنیاتنەر، کە سوودی بۆ کۆمەڵ هەبێت، جا بۆ کاری چاک ئامۆژگاری بکرێت یانیش بۆ دوورکەوتنەوە لەکاری خراپ وریا بکرێنەوە(١٠٧).

#### ٢- دەبێ ڕەخنەگر لە ڕەخنەکەیدا باوەڕی بە ڕاستی ئەو ڕەخنەیە هەبێت کە گرتوویەتی

واتە دەبێ ڕەخنەگر لە ناخەوە باوەڕی بە ڕاستی و دروستی ئەو ڕایە هەبێت کە دەریدەبڕێت، هەڵبەتە ئەمەش لەو دەستەواژانەدا دەردەکەون کە ڕەخنەگر بەکاری هێناون، هەروەها لەو ئامانجەشدا بەدەردەکەوێ کە ڕەخنەگر مەبەستی بووە.

لە بنەڕەتدا گریمانەدەکرێ کە ڕەخنەگر ڕاستگۆیەو نیازیشی پاکە لە ڕەخنەکەیدا، بەڵام ئەگەرهاتوو ئەو دەستەواژانەی کە بەکاری هێنابوون، دەستەواژەی توونددوتیژ بوون یان بابەتی نەبوون یانیش ڕەخنەگر خۆی لەو باوەڕەدابووە کە ئەو بیروڕایەی دەریدەبڕێت ڕاست نییە، ئەوە مانای ئەوەیە

---

١٠٧ - طارق احمد فتحي سرور، الحماية الجنائية لأسرار الأفراد في مواجهة النشر، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٦٧.

ڕەخنەگر نیازخراپ بووە لە ڕەخنەکەیدا. لەم حاڵەتەشدا، ئەرکی سەلماندنی نیازخراپیەکەی دەکەوێتە ئەستۆی ئەوکەسەی کە تۆمەتباری دەکات[108].

گرنگترین گەرینە (قرینة) بۆ سەلماندنی نیازخراپی ڕەختەگر، توندوتیژی ئەو دەستەواژانەیە کە لە ڕەخنەکەدا بەکارهاتوون بێ ئەوەی پێویست بێت، بەتایبەتی نەگونجانیان لەگەڵ ئامانجی ڕەخنەکە، هەرچەندە مەرجیش نیە تەنها لەڕێگای ئەو دەستەواژانەی کە لە وتارەکەدا بەکارهاتوون، نیازخراپی ڕەخنەگرمان بۆ دەربکەوێ، بەڵکو دەکرێ بەهەر ڕێگایەکی‌تر بگەینە ئەم مەبەستە.لەوانە هەوڵدانی ڕەخنەگر بۆ وەدەستهێنانی سوودێك یان دارلیەك بەرامبەر ڕاگرتنی هەڵمەتی ڕەخنەگرتنەکە یان بوونی ناکۆکی لەنێوان ڕەخنەگرو ئەوکەسەی ڕەخنەکەی ئاراستەکراوە[109].

شایەنی ئامازەبۆکردنە، نیازپاکی هۆیەکی گشتیە لە هۆیەکانی ڕێگادان بە هەموو تاوانێك لەوانە تاوانی ئانەوتەشەر، ئەگەرهاتوو ئەنجامدەر نیازی پاکبووبێت یان لەو باوەڕە دابووبێت ئەو کردارەی کە ئەنجامی دەدات ڕەوایە، هەروەهـــا بۆ ئەم مەبەستە پشتی بە هەندێك پاساوی ماقوڵ بەستبێت[110].

---

١٠٨ - د. محمود نجيب حسني ، شرح قانون العقوبات – القسم الخاص – جرائم الاعتداء على الاشخاص، سەرچاوەی پێشوو، ل٦٤٥.

١٠٩ - د. محمود نجيب حسني ، شرح قانون العقوبات – القسم الخاص – جرائم الاعتداء على الاشخاص، سەرچاوەی پێشوو، ل-٦٤، هەروەها طارق احمد فتحي سرور، الحماية الجنائية لأسرار الافراد في مواجهة النشر، سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٩.

١١٠ د. عبدالحميد الشواربي ، جرائم الصحافة والنشر، سەرچاوەی پێشوو، ل٩٧.

## دووەم: تاوانی جوێنپێدانی ئاشکرا [١١١]

تاوانی جوێنپێدان یەکێکە لەو تاوانانەی کە دەبێتە مایەی ناووناوبانگ زڕاندن و لەکەدارکردنی شەرەف و کەرامەتی ئەوکەسەی کە تاوانەکەی دەرهەق دەکرێ. هەروەها تاوانێکە کە بە ئاشکرا یا نائاشکرا لە ڕێگای قسە یا وێنە یا نووسینەوە ئەنجام دەدرێت. بەڵام لە حاڵەتی ئەنجامدانی بە هەر ڕێگایەک لە ڕێگاکانی ئاشکرایی، سزاکەی توندتر دەبێت.

یاسای سزادانی عێراقی ژمارە (١١١)ی ساڵی ١٩٦٩ی هەموارکراو ماددەی (٤٣٤،٤٣٦)ی بۆ تاوانی جوێنپێدان تەرخانکردووە.

بۆ ئەوەی زیاتر بە جوێنپێدانی ئاشکرا ئاشنابین کە دوای تاوانی تانەوتەشەر گرنگترین تاوانە لەو تاوانانەی کە بە ڕێگایەک لە ڕێگاکانی ئاشکرایی ڕوودەدات. تاکو ئێستا تاوانی جوێنپێدان لە هەرێمی کوردستاندا. دژی ڕۆژنامەنووسان و هاوڵاتیان دەیان کێشەی لێکەوتۆتەوە. هەندێکیش لەو کێشانە بۆ دادگا بەرزکراونەتەوە.

لەڕاستیدا، هۆی ڕوودانی زۆربەی ئەو تاوانانە، لەلایەک دەگەڕێتەوە بۆ لێکحاڵینەبوونی ڕۆژنامەنووسان و هاوڵاتیان، لەلایەکی تریشەوە دەگەڕێتەوە بۆ بێ ئاگایی سنووری ئازادیی ڕادەربڕین. بۆیە توێژینەوەی ئەم بابەتەمان بەپێویست زانی. بۆ ئەم مەبەستە لە خوارەوە لە سێ خاڵدا باسی ئەو تاوانانە لە یاسای سزادانی عێراقیدا دەکەین. خاڵی یەکەم تەرخاندەکەین بۆ پێناسەو ڕایەڵەکانی تاوانی جوێنپێدان و خاڵی دووەمیش تەرخاندەکەین بۆ سزاکەی و لە خاڵی سێیەمیشدا باسی هۆیەکانی ڕێگاپێنەدانی دەکەین:

---

١١١ - ئەم بابەتە لە بنەڕەتدا توێژینەوەیەکی زانستییەو پێشکەشی گۆڤاری سەنتەری برایەتی کراوەو ڕەزامەندی بۆ بڵاوکردنەوەی وەرگیراوە.

## ١- پێناسەی جوێنپێدانو رایەڵەکانی

### ٢- پێناسەی جوێنپێدان

جوێنپێدان بریتییە لە لەکەدارکردنی شەرەفو کەرامەتو ئیعتیاری کەسێك بە ئەنقەست، بەبێ ئەوەی ڕووداوێکی دیاریکراوی تێدا بدرێتەپاڵ [١١٢]

یاسای سزادانی عێراقی ژمارە (١١١)ی ساڵی ١٩٦٩ی هەموارکراو، لە ماددەی (٤٣٤)دا پێناسەی جوێنپێدانی کردووەو دەڵێ: (( **جوێنپێدان بریتییە لە لەکەدارکردنی شەرەفو ئیعتبارو بریندارکردنی هەستی کەسێك هەرچەندە ڕووداوێکی دیاریکراویش نەدرابێتەپاڵ ئەوکەسە. ئەوکەسەی جوێن بەکەسێك دەدات، بە بەندینشینکردن بۆ ماوەیەك کە لە ساڵێك زیاتر نەبێت لەگەڵ غەرامەیەك لە سەد دینار زیاتر نەبێت یان بە یەکێك لەو دوو سزایە، سزا دەدرێت. ئەگەرهاتوو جوێندانەکە لە ڕێگای ڕۆژنامەگەرییەوە یا چاپەمەنییەوە یا لە ڕێگایەکی‌تری ڕاگەیاندن ڕوویدا، ئەوا بە بارودۆخێکی توند دادەنرێت** )) [١١٣]

لەم دەقەی سەرەوەدا بۆمان دەردەکەوێ، تاوانی جوێنپێدانی ئاشکرا سێ ڕایەڵی هەیە، ڕایەڵی بەئاشکرایی‌و ڕایەڵی ماددی‌و ڕایەڵی مەعنەوی.

---

١١٢- د. محمود نجيب حسني ، شرح قانون العقوبات – القسم الخاص – جرائم الاعتداء على الاشخاص، منشورات دار النهضة العربية، مطبعة جامعة القاهرةو الكتاب الجامعي، القاهرة، ١٩٧٨، ل٦٤٦.

١١٣- ئەمەش دەقەکەیەتی بە زمانی عەرەبی ، (( السب هو رمي الغير بما يخدش شرفه او اعتباره او يجرح شعوره وان لم يتضمن ذلك اسناد واقعة معينة. ويعاقب من سب غيره بالحبس مدة لاتزيد على سنة وبغرامة لاتزيد على مائة دينار او بأحدى هاتين العقوبتين. واذا وقع السب بطريق النشر في الصحف او المطبوعات او بأحدى طرق الاعلام الاخرى عد ذلك ظرفا مشددا)).

## ٢-١ ڕایەڵەکانی تاوانی جوێنپێدان

لە پێناسەی تاوانی جوێنپێداندا کە لە برگەی یەکەمی ماددەی (٤٣٤)دا هاتووە، کە پێشتر ئامازەمان پێی کرد، بۆمان دەردەکەوێ کە تاوانی جوێنپێدانی ئاشکرا سێ ڕایەڵی هەیە، ڕایەڵی بەئاشکرایی و ڕایەڵی ماددی و ڕایەڵی مەعنەوی:

### ١-٢-١ ڕایەڵی بەئاشکرایی

بەئاشکرایی لەڕووی زاراوەییەوە بەمانای گەیاندنی زانیاری دێت لەبارەی ڕووداوێک یا کردارێکی دیاریکراوەوە بەخەڵک جا چ بەقسەبێت یا بەکردار یا بەنووسین یانیش بەهەر هۆکارێکیتری گەیاندن بێت.

لە تاوانی جوێنپێداندا، بڵاوکردنەوەو ئاشکرایی ڕایەڵێکی تایبەتییە لە ڕایەڵەکانی ئەم تاوانە لەپاڵ هەردوو ڕایەڵی ماددی و ڕایەڵی مەعنەویدا و بە بەبوونی ئەم ڕایەڵە تاوانی جوێنپێدانی ئاشکرا بەگوێرەی ئەو وەسفەی کە لە دەقی ماددەی (٤٣٤)دا بۆی کراوە، ڕوونادات.

یاسای سزادانی ژمارە (١١١)ی ساڵی ١٩٦٩ی هەمووارکراو لە برگەی سێیەمی ماددەی (١٩)دا بەم شێوەیەی خوارەوە هۆکارەکانی بەئاشکرایی (وسائل العلانیة) ی دەستنیشانکردووە[١١٤] :

---

١١٤ - ئەمەش دەقەکەیەتی بە زمانی عەرەبی : (( ٣- العلانية: تعد وسائل العلانية:

أ- الأعمال او الاشارات او الحركات اذا حصلت في طريق عام او في محفل عام او مكان مباح او مطروق او معرض لانظار الجمهور او اذا حصلت بحيث يستطيع رؤيتها من مكان في مثل ذلك المكان او اذا نقلت اليه بطريقة من الطرق الآتية.

ب- القول او الصياح اذا حصل الجهر به او ترديده في مكان مما ذكر او اذا حصل الجهر به او ترديده بحيث يستطيع سماعه من كان في مثل ذلك المكان او اذا اذيع بطريقة من الطرق الالية وغيرها بحيث يسمعه من لادخل له في استخدامه.

ج- الصحافة والمطبوعات الأخرى وغيرها من وسائل الدعاية والنشر.

د- الكتابة والرسوم والصور والشارات والافلام ونحوها اذا عرضت في مكان مما ذكر او اذا وزعت او بيعت الى اكثر من شخص او عرضت للبيع في اي مكان )).

١ كردەوەو نیشارەتو جوڵانەوە نەگەرهاتوو لە ڕێگایەکی گشتی یان شوێنێکی گشتیدا ڕوویدا بەجۆرێک ئەوکەسانەی کە لەو شوێنەن بتوانن بیبینن.

٢ قسەکردنو هاوارکردن لە شوێنەگشتییەکان بەجۆرێک ئەوکەسەی کە لەوشوێنەیە بتوانێ گوێی لێ بێت.

٣ ڕۆژنامەگەریو چاپەمەنیو کەناڵەکانی تری ڕاگەیاندن.

٤ نووسینو ڕەسمو وێنەو فیلمو شارە نەگەرهاتوو لە شوێنەگشتییەکاندا نمایشکرا یا دابەشکرا یا بەزیاتر لەکەسێک فرۆشرا یا لەهەرشوێنێک بۆ فرۆشتن نمایشکرا.

کەواتە، نەگەرهاتوو جوێنپێدانەکە بەئاشکرایی بە ڕێگایەک لەو ڕێگایانەی سەرەوە ڕوویدا، ئەوا بە جوێنپێدانی ئاشکرا دادەنرێتو لەو حاڵەتەشدا سزایەکەی لە سزای جوێنپێدانی نائاشکرا توندتر دەبێت. جا نەگەرهاتوو تاوانەکە لە ڕێگای ڕۆژنامەگەرییەوە ڕوویدا، ئەوا بە تاوانی ڕۆژنامەگەری دادەنرێت، بەڵام ئەمە هیچ لە سروشتو سزای تاوانەکە ناگۆڕێت، چونکە ڕۆژنامەگەری بە هەموو جۆرەکانییەوە (چاپکراو، بیستراو، بینراو، بیستراووبینراو، ئینتەرنێت) هۆکارێکە لە هۆکارەکانی بەئاشکرایی.

شایەنی ئاماژەپێکردنە، یاسادانەری عێراقی، هۆکارەکانی بەئاشکرایی کە لە ماددەی (١٩)دا ئاماژەیان پێکراوە بە شێوەیەکی دیاریکراوو گەمارۆدراو دەستنیشان نەکردووە، بەڵکو بەنموونە هێناویەتیو دەکرێ نموونەی تریان لەسەر وەربگیرێن. ئەمەش وادەخوازێ ئەرکی لێکدانەوەی بوونو نەبوونی ئاشکرایی لە ڕوودانی ئەو تاوانەدا لەبەر ڕۆشنایی ئەو نموونانەی کە لە دەقی ئەو ماددەیەدا هاتوون، بە دادوەر بسپێردرێت.

جا لەبەرئەوەی ئاشکرایی ڕەگەزێکی تایبەتە لە ڕەگەزەکانی تاوانی جوێنپێدانی ئاشکرادا، بۆیە دەبێ دادگا لە حوکمەکەیدا بایەخبدات بە دەستنیشانکردنی ئەو هۆکارەی کە لە ڕێگایەوە ڕوویدا، بۆئەوەی دادگای پیاچوونەوە بتوانێ بە ڕۆڵی خۆی لە چاودێریکردنی جەسپاندنی یاسا

بەشێوەیەکی ڕاست و دروست ببینێ، جا فەرامۆشکردنی ئەو زانیارییە حوکمەکە لەکەدار دەکات و دەبێتەهۆی ڕەتکردنەوەی لەلایەن دادگای پیاچوونەوە[115].

هەروەها لە حوکمێکی تریدا دەڵێ: (( مادام ئاشکرایی ڕەهەڵێکە لە ڕەهەڵە گرنگەکانی تاوانی جوێنپێدان، بۆیە لەو حوکمەدا کە دادوەر بۆ ئەم تاوانە دەریدەکات دەبێ ئەو شوێنە دیار بکرێت کە جوێنەکەی لێ دراوە، بۆ لێکۆڵینەوە لە بوونی مەرجی ئاشکرایی، ئەگەر ئەمەی دیارنەکرد، حوکمەکە بە حوکمێکی پووچەڵ دادەنرێت))[116].

---

١١٥ - قرار محكمة النقض المصرية، جلسة ١٩٤٠/١٢/٢ طعن رقم ٢٤ سنة ١١ ق، بڕوانە للمستشار معوض عبد التواب، القذف والسب والبلاغ الكاذب، منشورات دار المطبوعات الجامعية، اسكندرية، ١٩٨٨، ل١٥٩.

١١٦ - محكمة النقض والابرام، فبراير سنة ١٩١٨ المجموعة الرسمية سنة ١٩١٨ ص٥٤، بڕوانە المستشار مصطفى مجدي هرجة، التعليق على قانون العقوبات في ضوء الفقه والقضاء – القسم الخاص، الكتاب الثالث، ط/١، منشورات منشأة المعارف، اسكندرية، ١٩٨٨، ٨٨-٨٩.

### ١-٢-٢ ڕایەڵی ماددی

تەنها بیرکردنەوە لە ئەنجامدانی تاوان، بەتاوان دانانرێ، مەگەر ئەم بیرکردنەوەیە لە قەوارەیەکی ماددیی هەستپێکراوەوە بەرجەستەبێت کە پێی دەوترێ ڕایەڵی ماددی تاوان. واتە ئەو هیواو ئاوات و ئارەزووو بیرو هزرانەی کە لەناو مێشکدا دەخولێنەوە بە ڕایەڵی ماددی دانانرێن هەتا ئەبن بە چالاکییەکی هەستپێکراو لە واقیعدا. بۆیە ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ یاسای سزادانی ژمارە (١١١)ی ساڵی ١٩٦٩ دەبینین لە ماددەی (٢٨)دا بەم شێوەیەی خوارەوە پێناسەی ڕایەڵی ماددیی تاوانی کردووەو دەڵێ: ((ڕایەڵی ماددیی تاوان بریتییە لە ڕەفتارێکی تاوانکاری لە کردنی کردارێك یا نەکردنی کردارێك کە یاسا فەرمانی پێکردووە)).

لەم ماددەیەدا بۆمان دەردەکەوێ کە ڕایەڵی ماددیی لە تاوانی تەواودا لە سێ ڕەگەز پێکدێت ئەمانیش بریتین لە ڕەفتاری تاوانکاری و ئەنجامی زیانبەخش و پەیوەندی هۆکاری لەنێوان ڕەفتاری تاوانکاری و ئەنجامی زیانبەخشدا.

لە تاوانی جوێنپێداندا، ڕایەڵە ماددییەکە بریتییە لە ئاراستەکردنی ئەو دەستەواژانەی کە شەرەف و کەرامەت و ئیعتبار لەکەدار دەکەن یان لکاندنی لەکە یا خەوشێکی دیاریکراو بە کەسێکەوە بەبێ ئەوەی ڕووداوەکەی دیاریکرێت[١١٧].

مەبەست لە لەکەدارکردنی دیاریکراو هەموو کەمکردنەوەیەکە لە سیفەتەکانی ئەوکەسەی کە ئەو لەکەیەی دراوەتەپاڵ یا سوکایەتیکردن بە ڕەوشتی یا زیانئامەی. جا ئەوکەسەی بە یەکێك دەڵێ دز یا ساختەچی یا فێڵباز یان سەرخۆش یا دووڕوو. ئەوا لە ڕێگای ئەم دەستەواژانەوە خەوشێکی یا لەکەیەکی دیاریکراو دەداتەپاڵ ئەوکەسە[١١٨].

---

١١٧ - احمد امين، شرح قانون العقوبات — القسم الخاص، ط/٢، منشورات مكتبة النهضة، بيروت-بغداد، بلاسنة النشر، ل٥٦٠.

١١٨ د. عبدالحميد الشواربي، جريمة القذف والسب في ضوء القضاء والفقه، منشورات دار المطبوعات الجديدة، اسكندرية، ١٩٨٥، ل١٠٦.

بەڵام سەبارەت بەو دەستەواژانەی کە شەرەف و نامووس و ئیعتیبار لەکەدار دەکەن، بریتییە لە هەر دەستەواژەیەك کە ببێتە مایەی دەستدرێژیکردنەسەر شەرەف و نامووسی تاوانبەرهەڵکراو یان ناوونابانگ زڕاندنی لەنێو خەڵکدا.

ئەگەر واتای ئەمە بە ڕەهایی وەربگرین، لکاندنی لەکەدارکردنی دیاریکراو دەگرێتەوە. وەك ئەوکەسەی بە یەکێك دەڵێ سەگباب یان مەیموون. بەڵام لەوانەیە هەندێجار شەرەف و نامووس و ئیعتیبار لەکەدار دەکرێت بەبێ ئەوەی خەوشێکی یا لەکەیەکی دیاریکراو بە خاوەنەکەی بلکێنرێت، وەك ئەوکەسەی بە یەکێك دەڵێ خوا لە تۆ خراپتری دروس نەکردووە یا گیانی بەزەییت نیە[119].

جا ڕێگاو جۆنێتی لکاندنی لەکەدارییەکە، هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێت. بۆیە چ بە شێوەی ئەنکید بێت یا بە گومانەوە بێت یا لەشێوەی پرسیار بێت یا بە ئاماژەبۆکردن بێت یا زەمکردنێکی لەبەماى ستایشەوە بێت. هەروەها بەنووسین بێت یا بە قسە یا بە جووڵە یا بە هەر شێوازێکی تری گوزارشتکردن بێت، وەکو یەکە[120].

---

١١٩ - احمد امين، شرح قانون العقوبات – القسم الخاص، سەرچاوەی پێشوو، ل٥٦٠.

١٢٠ - د. ابراهيم الداقوقي، قانون الاعلام، منشورات جامعة بغداد، مطبعة وزارة الاوقاف والشؤون الدينية، بغداد، ١٩٨٦، ل٢٥٥.

### ١-٢-٢ ڕایەڵی مەعنەوی

تاوانی جوێنپێدان لە بنەڕەتدا تاوانێکی بەئەنقەستە بۆیە ڕایەڵە مەعنەویەکەی خۆی لە مەبەستی تاوانکاریدا دەبینێتەوە کە مەبەستێکی گشتیەو پشت بە هەردوو ڕەگەزی ئاگاداری و ئیرادە (العلم والارادة)وە دەبەستێت[١٣١].

کەواتە هەرکاتێک مەبەستی تاوانکاری هەردوو ڕەگەزەکەی تێدابوو، ڕایەڵی مەعنەوی تاوانی جوێنپێدان دێتەدی بەبێ گوێدانەوەی ئایا هۆی ئەنجامدانی چی بووەو چی نەبووە؟ چونکە هۆی ئەنجامدانی ئەو تاوانە، ڕەگەزێک نیە لە ڕەگەزەکانی مەبەستی تاوانکاری[١٣٢].

دادگای پیاچوونەوەی میسری (محكمة النقض المصرية) لەمبارەیەوە لە بڕیارێکیدا دەڵێ: ((لە تاوانەکانی جوێنپێدان و ئابڕوبەشەردا، هەرکاتێک ئەو دەستەواژانەی کە ئاراستەی تاوانبەرەکراو کراون، ئەگەر خۆی لەخۆیدا ناشیاو بێت، مەبەستی تاوانکاری بوونی دەبێت ))[١٣٣].

کەواتە، ئەگەرهاتوو ئەو دەستەواژانەی کە لە جوێنەکەدا بەکارهاتبوون خۆی لەخۆیدا مانای جوێن ببەخشێت، ئەوکاتە هیچ پێویست بە سەلماندنی بوونی مەبەستە تاوانکاریەکە ناکات، بەڵکو لەجیاتی ئەوە، گریمانەی بوونی مەبەستی تاوانکاری لەلایەن تۆمەتبارەوە دەکرێت، لەو حاڵەتەشدا تۆمەتبار بۆی هەیە پێچەوانەی ئەمە بسەلمێنێ.

---

١٣١ - المستشار معوض عبد التواب، القذف والسب والبلاغ الكاذب، سەرچاوەی پێشوو، ل١٥٣.

١٣٢ - المستشار مصطفى مجدي هرجة: التعليق على قانون العقوبات في ضوء الفقه والقضاء – القسم الخاص، سەرچاوەی پێشوو، ل٨٨.

١٣٣ - الطعن رقم ٢٢٤ لسنة ٤٠ ق جلسة ١١/٥/١٩٧٠ س٢١ ص٦٩٢ بروايه المستشار معوض عبد التواب، القذف والسب والبلاغ الكاذب، سەرچاوەی پێشوو، ل١٥٧.

## ٢- سزای جوێنپێدانی ئاشکرا

لە پاشبەندی ماددەی (٢٤)ی یاسای سزادانی عێراقیدا هاتووە:

((ئەوکەسەی جوێن بە کەسێك دەدات، بە بەندینشینکردن بۆ ماوەیەك کە لە ساڵێك زیاتر نەبێت لەگەڵ غەرامەیەك لە سەد دینار زیاتر نەبێت یان بە یەکێك لەو دوو سزایە سزا دەدرێت. ئەگەرهاتوو جوێنپێدانەکە لە ڕێگای ڕۆژنامەگەرییەوە یا چاپەمەنییەوە یان یەکێك [illegible] ڕێگاکانی تری ڕاگەیاندن روویدا، ئەوا بە باروودۆخێکی توند دادەنرێت)).

لەم دەقەدا بۆمان دەردەکەوێت، یاسادانەری عێراقی جیاوازی کردووە لە نێوان جوێنپێدان لە ڕێگای بڵاوکردنەوەو غەیری بڵاوکردنەوەدا بۆیە لە حاڵەتی ئەنجامدانی لە ڕێگای بڵاوکردنەوەدا سزاکەی توند کردووە.

کەواتە، لە حاڵەتی ئەنجامدانی جوێنپێدانەکە بەڕێگایەك لە ڕێگاکانی جگەلە بڵاوکردنەوەوە، دادگا بۆی هەیە ئەوکەسە کە جوێنی داوە سزا بدات بۆ ماوەیەك کە لە ساڵێك زیاتر نەبێت لەگەڵ غەرامەیەك لە سەد دینار زیاتر نەبێت یا بە یەکێك لەو دوو سزایە[124]. بەڵام لە حاڵەتی ئەنجامدانی جوێنپێدانەکە بە ڕێگایەك لە ڕێگاکانی بڵاوکردنەوە، بۆی هەیە سزایەکەی توند بکات بە جۆرێك ماوەی بەندینشینکردنەکە بگەیەنێتە دە ساڵ[125].

---

١٢٤ - شایەنی ئاماژەبۆکردنە، بڕی ئەو غەرامەیەی کە لە ماددەی ناوبراودا هاتووە بەپێی بڕیاری ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش ژمارە (٢٠٦)ی ١٩٩٤/١١/٢٣ گۆڕاوەو کەمترین بڕی بۆتە (٢٠١) دینارو دوادەمەی (١٠٠٠) دینارە لە تاوانەکانی کەتندا، بڕوانە ڕۆژنامەی "الوقائع العراقية" ژمارە (٣٥٤٠) لە ١٩٩٤/١٢/٥.

١٢٥ - بڕوانە دەقی ماددە (١٣٦)ی یاسای سزادانی عێراقی کە تیایدا هاتووە : (( اذا توافر في جريمة ظرف من ظروف المشددة يجوز للمحكمة ان تحكم على الوجه الاتي:- ١- ...... ٢- اذا كانت العقوبة السجن المؤقت او الحبس جاز الحكم بأكثر من الحد الأقصى للعقوبة المقررة للجريمة بشرط عدم تجاوز ضعف هذا الحد على ان لاتزيد

## ٣- هۆیەکانی ڕێگاپێدانی

مەبەستمان لە جوونی ڕێگاپێدراو، ئەو جوونەیە کە لە بنەڕەتدا بە تاوان دانـراوەو گشت ڕەهەندەکانیشی تێدایە لە بنەڕەتیشدا یاسا سزای بۆ داناوە، بەڵام ئەگەر ڕوویدا، لەبەر هەندێك ئیعتبار. لە هەندێك حاڵەتی دیاریکراودا، ئەنجامدەرەکەی سزا نادرێت.

یاسای سزادانی عێراقی لە ماددەی (٤١)دا بۆ ڕێگادان بە جوونی، پرنسیپێکی گشتی داناوە، ئەمەش دەقەکەیەتی : (( بە تاوان دانانرێت ئەگەرهاتوو کردەوەکە لە ئاکامی بەکارهێنانی مافێك کە یاسا دانی پێداتابێت ڕوویدات .... ))، بەپێی ئەم دەقە، لەهەندێ حاڵەتدا، جوونپێدانەکە ڕوودەدات، مەبەستی تاوانکاریشی لەگەڵدایە، بەڵام بە مەبەستی مومارەسەکردنی مافێك کە یاسا دانی پێداناوە جوونپێدانەکە ڕێگای پێ دەدرێت و ئەنجامدەری جوونەکەش لە سزا دەبەخشرێت.

کەواتە، هەرکاتێك هۆیەك لە هۆیەکانی ڕێگاپێدانی جوونپێدانەکەو مەرجەکانی هەبوون، ئاکامێکی ڕاستەوخۆی بەسەر ڕێگاپێدانی ئەو جوونپێدانەوە دەبێت. جا دەکرێ جوونپێدانەکە بە مەبەستی بەرگری لەخۆکردنی ڕەوا بێت، ئەگەرهاتوو، ئەو کەسەی کە بەرگری لەخۆی دەکات (المدافع) بۆ بەرپەچدانەوەی جوونی دەستدرێژیکەر (المعتدي) جوونەکەی ئاراستەی ئەو کردبێت. یانیش لە کاتی بەرگریکردنی لە مافی خۆیدا، لەبەردەم دادگا یا دەسەڵاتی لێکۆڵینەوە یا دەسەڵاتەکانی تردا، لەو سنوورەی کە داکۆکیکردنەکە پێویستی پێیەتی، جوونەکەی ئاراستەی نەیارەکەی (خصمە) کردبێت[١٣٦]، هەروەها ئەوکەسەی کە تاوانی جوونپێدان ئەنجام دەدات، ئەگەرهاتوو لە حاڵەتی تووڕەبووندا، لە ئاکامی

---

مدة السجن المؤقت في اي حال خمس وعشرين سنة ومدة الحبس على عشر سنوات ....)).

١٣٦ - بڕوانە دەقی ماددەی (٤٢)ی یاسای سزادانی عێراقی کە تیایدا هاتووە (( لاجريمة اذا وقع الفعل استعمالا لحق الدفاع الشرعي ... )).

ئەو دەستدرێژییە ناڕەوایەی کە کراوەتە سەری. ئەمەی ئەمجامەدا لەسزا دەبەخشرێت[١٢٧].

شایەنی ئاماژەبۆکردنە. تەنها لەو حاڵەتانەی سەرەوە ڕێگا بە جوێنپێدان نادرێت، بەڵکو ئەوانە بەشێکن لەو حاڵەتانەی کە سەرچاوە گشتییەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ ماددە (٤١)ی یاسای سزادان کە لە سەرەوە ئاماژەمان پێی کردووەو دەکرێ گەلێك جێبەجێکردنی دیکەی لێ هەڵێنجین لەوانە دەکرێ جوێنەکە بە مەبەستی داکۆکیکردنی ڕەوابێت یان بەمەبەستی بەکارهێنانی تانوولێدانبێت لە کردەوەی فەرمانبەران و ئەوکەسانەی کە لە حوکمی ئەودانە یان بەمەبەستی ڕەخنەگرتنی بابەتیانەبێت.

هەرچەند یاسای سزادانی عێراقی بە پێچەوانەی یاسای سزادانی میسری، ڕاشکاوانە ڕێگای بەو جوێنە نەداوە کە پەیوەندیی هەیە بەو تانەوتەشەرەی کە ئاراستەی فەرمانبەرێك یا ئەوکەسانەی کە لە حوکمی ئەودانە دەکرێ[١٢٨]. بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ، ئەگەر هاتوو، ئەو جوێنەی بە

---

١٢٧ - بڕوانە دەقی ماددە (٤٣٦)ی یاسای سزادانی عێراقی کە تیایدا هاتووە ، (( ١ لاجریمة فیما یسنده احد الخصوم او من ینوب عنهم الی الاخر شفاها او کتابة من قذف وسب اثناء دفاعه عن حقوقه امام المحاکمة وسلطات التحقیق او الهیئات الاخری وذلك فی حدود مایقتضیه هذا الدفاع ٢- ولاعقاب علی الشخص اذا کان قد ارتکب القذف او السب وهو فی حالة غضب فور وقوع اعتداء ظالم علیه )).

١٢٨ - یاسای سزادانی میسری لە ماددەی (١٨٥)دا ڕێگای بەو جوێنە داوە کە بە فەرمانبەران و ئەوکەسانە دەدرێ کە لە حوکمی ئەودانە، ئەگەرهاتوو، جوێنەکە پەیوەندیی بەو تانەوتەشەرەوە هەبوو کە بە نیازپاکی ئاراستەی ئەوکەسانە کراوە ئەمەش دەقەکەیەتی: (( هەرکەسێك جوێن بە فەرمانبەرێکی گشتی یا کەسێك کە سیفەتی بریکاری گشتی تێدابێت یا خزمەتگوزارییەکی گشتی لە ئەستۆ بێت، بدات، بەهۆی ڕاپەڕاندنی ئەو فەرمانە یا ئەو بریکارێتییە یا ئەو خزمەتگوزارییە گشتییە، بە بەندیخانەکردن بۆ ماوەیەك کە لە ساڵێك زیاتر نەبێت لەگەڵ غەرامەیەك کە لە بیست جونەی کەمتر نەبێت و لە سەد جونەی زیاتر نەبێت یا

فەرمانبەرێك یا ئەوكەسانەی كە لە حوكمی ئەودانە درا. ئەگەر پەیوەندی بەو تانەوتەشەرەوە هەبوو، كە لەلایەن هەمان تاوانبارەوە ئاراستەی هەمان كەس كرابوو. ڕێگای پێ نەدرێت، مادام پەیوەندی ئاراستەكردنی تانەوتەشەرەكەوە ئاراستەی ئەوكەسە كراوەو بۆتە بەشێك لەو ڕووداوەی دراوەتە پاڵی. ئەگینا فەرمانبەران و ئەوكەسانەی كە لە حوكمی ئەودانە لە ڕەخنەگرتن و جوێن و

---

بە یەكێك لەو دوو سزایە، سزا دەدرێ بەمەرجێك لەگەڵ حوكمی بڕگەی دووەمی ماددەی (٢٠٢) ناكۆك نەبێت، ئەگەرهاتوو جوێنەكە پەیوەندی بەو تاوانەی تانەوتەشەرەوە هەبوو كە هەمان تاوانبار دژی هەمان ئەوكەسەی كە جوێنی پێدراوە، ئەنجامیداوە )). بێگومان لە گەڕانەوەماندا بۆ دەقی بڕگەی دووەمی ماددەی (٢٠٢)ی یاسای سزادانی میسری، بۆمان دەردەكەوێ یاسادانەری میسری ڕێگای بەو جوێنە داوە كە پەیوەندیی بەو تاوانەی تانەوتەشەرەوە هەیە كە هەمان ئەوكەسەی جوێنەكەی داوە، دژی تاوانبەرهەڵكراو ئەنجامیداوە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت كە تاوانی جوێنپێدان خۆی لەخۆیدا ڕێگای پێ نەدراوە، بەڵام ئەگەر پەیوەندی بە تانەوتەشەرەوە هەبوو، لەو حاڵەتەدا بە بۆنەی تانەوتەشەری ڕێگاپێدراوەوە ڕێگای پێ دەدرێت كە ئەمەش دەقەكەیەتی: (( هەركەسێك بەڕێگایەك لەو ڕێگایانەی كە لە ماددەی (١٧١)ی ئەم یاسایەدا هاتووە، شتێك بداتەپاڵ كەسێكی ترەوە بە تانەوتەشەر دادەنرێت، ئەگەرهاتوو ئەو شتە ڕاست دەرچێ و ببێتەمایەی سزادانی ئەوكەسەی ئەوشتەی دراوەتە پاڵ بەپێی یاسا یا بەكەمزانینی لەلایەن خەڵكی نیشتمانەكەی. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو تانووتلێدانەی كە لە كارەكانی فەرمانبەری گشتی یا ئەوكەسەی كە سیفەتی بریكاری گشتی تێدابێت یا خزمەتگوزاری گشتی لە ئەستۆدابێت دەگیرێت، ناچێتەژێر حوكمی ئەم ماددەیەوە، ئەگەرهاتوو بە نیازپاكی ئەنجامدراو سنووری كارەكانی وەزیفەو بریكارێتی و خزمەتگوزارییە گشتییەكە نەبەزاند، بەمەرجێك ڕاستی هەموو كردارێك بسەلمێندرێت كە دراوەتە پاڵی ... )).

تانەوتەشەری ڕێکابێدراو کە بۆ بەرژەوەندی گشتی یاسا دانی پێداناوە، ڕزگاریان دەبێت.

بۆیە، بەڕای ئێمە، ئەمە کەموکورتییەکە لە یاسای سزادانی عێراقیداو پێویستە چارەسەر بکرێت.

لەبەرئەوەی لەکاتی بەرگری لەخۆکردن و لە کاتی بەکارهێنانی حەسانەی پەرلەمانیو لەکاتی مومارەسەکردنی مافی ڕەخنەگرتندا ڕێگا بە جوێنپێدان دەدرێت. بۆیە لە سێ خاڵدا لە خوارەوە بە درێژی باسی ئەو حاڵەتانە دەکەین:

## ٣ ١ جوینداننیپیدان لەکاتی بەرگری لەخۆکردندا

مافی بەرگریکردن لەبەردەم دادگا، یەکێکە لە مافە سەرەکییەکانی مرۆڤ [١٢٩] و ئەمڕۆ بۆتە مافێکی دەستووری. دوای ئەوەی دەستووری عێراقی ساڵی ١٩٧٠ لە بڕگەی (ب) ماددەی (٢٠)دا دانی پێدانناوە. کە ئەمەش دەقەکەیەتی: (( مافی بەرگری لەخۆکردن لە هەموو قۆناغەکانی لێکۆڵینەوەو دادگاییکردن، بەپێی حوکمەکانی یاسا، پیرۆزە)). هەروەها هۆیەکە لە هۆیەکانی ڕێگابیندانی جوێن لەکاتی موماڕەسەکردنی مافی بەرگری لەخۆکردن لەبەردەم دادگادا.

یاسای سزادانی عێراقی ژمارە (١١١)ی ساڵی ١٩٦٩ی هەمووارکراو لە بڕگەی یەکەمی ماددەی (٤٣٦)دا دەڵێ: (( ئەو تانەوتەشەرو جوێنانەی کە بە قسە [illegible] بە نووسین بە یەکێك لە نەیارەکان (الخصوم) یا ئەوکەسانەی بریکاری ئەوانن لە کاتی داکۆکی لەخۆکردن لەبەردەم دادگاکان یا دەسەڵاتەکانی لێکۆڵینەوە یا دەستەکانیتردا لەو سنوورەی کە بۆ ئەو داکۆکیکردنە پێویستە، دەیداتەپاڵ لایەنەکەیتر، بەتاوان دانانرێ )).

لەم دەقەی سەرەوە بۆمان دەردەکەوێ، کە دەبێ تاوانبارو تاواندرهەڵکراو، هەردووکیان لەو دەعوایەدا نەیار بن. هەروەها دەبێ ئەو دەستەواژانەی کە جوێنیان لەخۆگرتووە، بەقسە یا بە نووسین لەبەردەم دادگا ئاراستە کرابن، هەروەها دەبێ ئەو دەستەواژانە لە سنووری پێویستی داکۆکیکردنەکە تێپەڕنەکردووە، ئەمەو دەبێ تاوانبار نیازی پاك بووبێت، چونکە نیازپاکی مەرجێکی گشتییە لە مەرجەکانی بەکارهێنانی ماف. ئەمەش مانای ئەوەیە کە دەبێ مافی بەرگری لەخۆکردن ئەم چوار مەرجانەی سەرەوەی تێدا بێت بۆئەوەی ئەو جوێنانەی کە تیایدا ئاراستەی تاواندرهەڵکراو دەکرێن بە جوێنی ڕێگاپێدراو دابنرێن.

---

١٢٩ - بڕوانە دەقی ماددە (٨)ی جاڕنامەی جیهانیی مافەکانی مرۆڤ کە ئەمەش دەقەکەیەتی: (( هەموو کەسێك بۆ داوەرییکردن و پاراستنی مافە بنەڕەتییەکانی خۆی، مافی پەنابردنەبەر دادگا نیشتمانییەکانی هەیە لەکاتی دەستدرێژیکردنەسەری و ئەمەش یاسا پێی بەخشیوە )).

## ٢-٢ جوێنپێدان لە کاتی بەکارهێنانی حەسانەی پەرلەمانیدا

ئەو ڕۆڵەی کە بەپەرلەمانتاران بێیان دراوە بۆ گوزارشتکردن لە ویستو ئارەزووی گەل. وا دەخوازێت ئازادییەکی تەواو بە پەرلەمانتاران ببەخشرێت بۆ گوزارشتکردن لە بیروڕای خۆیان. زۆربەی وڵاتانی دنیا بۆ ئەم مەبەستە لە دەستووردا دانیان بە حەسانەی پەرلەمانی ناوە. کە حەسانەیەکی دوولایەنە: حەسانەیەکی بابەتیانەیە، کە بریتییە لە ڕێگادان بە هەر تاوانێك لە تاوانەکانی بیروڕادەربڕین، کە تاوانی جوێنپێدان یەکێکە لەو تاوانانەو هەموو بیروڕایەك دەگرێتەوە کە لە دانیشتنەکانی پەرلەمان یا لە یەکێك لە لیژنەکانیدا دەربدەبڕدرێن. هەروەها حەسانەیەکی شێوەدیارە، کە بریتییە لە پاساغکردنی وەرگرتنی هەر ئیجرائاتێکی تاوانکاری دژی پەرلەمانتار، مەگەر دوای وەرگرتنی ڕەزامەندی پێشەکی پەرلەمان نەبێت. جا دەستووری عێراقی ساڵی ١٩٧٠ لە بڕگەی (أ)ی ماددەی (٥٠)دا دانی بەم حەسانەیەدا ناوەو دەڵێ: (( ئەندامانی ئەنجومەنی نیشتمانی بۆ ئەو بیروڕاو پێشنیارانەی کە لە کاتی مومارەسەکردنی ئەرکەکانیان دەریدەبڕن، لێپرسینەوەیان لەگەڵ ناکرێت )). هەروەها بڕگەی (ب)ی هەمان ماددەدا دەڵێ: (( نابێ لێپێچانەوەی هیچ ئەندامێك لە ئەندامانی ئەنجومەنی نیشتمانی بکرێت یا بگیرێت لەبەر تاوانێك لەکاتی خولەکانی بەستندا (خلال دورات الانعقاد) بەبێ وەرگرتنی ڕەزامەندی ئەنجومەن، مەگەر لە حاڵەتی گەورە کەتنێکی بینراودا نەبێت )).

لەم دەقانەی سەرەوەدا بۆمان دەردەکەوێ، حەسانەی پەرلەمانی بابەتیانە، هۆیەکە لە هۆیەکانی ڕێگادان بە تاوانی جوێنپێدان و ئەم حەسانەیەش حەسانەیەکی هەمیشەییەو پەرلەمانتار دوای کۆتاییهاتنی ماوەی پەرلەمانێتییەکەشی، لەسەر تاوانی جوێنپێدان دادگایی ناکرێت. ئەگەر هاتوو تاوانەکەی لەماوەی ئەندام بوونی لە پەرلەماندا ئەنجام دابێت. هەروەها ئەم حەسانەیە تەنها پەرلەمانتاران دەگرێتەوەو ئەو فەرمانبەر و کارمەندانە ناگرێتەوە کە لە پەرلەماندا کاردەکەن.

## ٢-٢ جوێنپێدان لەکاتی موومارەسەکردنی مافی ڕەخنەگرتندا

مافی ڕەخنەگرتن شێوەیەکە لە شێوەکانی ئازادی بیروڕادەربڕین. کە دەرفەت بە هاوڵاتیان دەدات تا لەڕێگای گوزارشتکردن لە بیروڕاکانیانەوە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بەشداری بکەن لە چارەسەرکردنی ئەو کێشانەی کە ڕووبەڕووی کۆمەڵ دەبنەوەو دەبنە ئاستەنگ لەبەردەمیدا. ئەویش بە دەستنیشانکردنی لایەنە نێگەتیڤەکانی ئەو کاروبارانە دەبێت کە مایەی باخپێدانی کۆمەڵن بۆ دۆزینەوەی ڕێگاچارەیان، هەروەها بوونەوەی جارێکیتر لە دوارۆژدا ڕوونەدەنەوە.

هەروەها ڕەخنەگرتن مافێکە لەو مافانەی کە یاسا دانی پێداناوە لەمیانی کەفالەتکردنی ئازادی بیروڕادەربڕین‌و کەفالەتکردنی توێژینەوەی زانستی‌و داهێناندا چونکە ڕەخنەگرتن بنچینەی توێژینەوەو داهێنانە. جا ڕەخنەگرتن لە دلنانی بە ماف پشت بە گرنگێتی ئەو بەرژەوەندییە دەبەستێ کە بۆ کۆمەڵ دەیهێنێتەدی[١٣٠]. دەستووری عێراقی ساڵی ١٩٧٠ لە ماددەی (٢٦) و (٢٧)دا بەشێوەیەکی زمنی دانی پێداناوە. لە ماددەی (٢٦)دا دەقنووسی کردووەو دەڵێ: (( دەستوور کەفالەت ئازادی بیروڕا دەکات ...))، هەروەها لە برگە (ج)ی ماددەی (٢٧)دا دەڵێ: (( دەوڵەت کەفالەتی ئازادی توێژینەوەی زانستی دەکاتو لە گشت چالاکییە هزری‌و زانستییەکاندا داهێنان‌و سەرکەوتن پاداشت‌و هان دەدات ))[١٣١].

---

١٣٠ - د. محمود نجيب حسني ، شرح قانون العقوبات – القسم الخاص – جرائم الاعتداء على الاشخاص، سەرچاوەی پێشوو، ل٦٢٦-٦٢٧.

١٣١ - دەستووری میسری ساڵی ١٩٧١ لە ماددەی (٤٧)دا بە ڕاشکاوییەوە دانی بە مافی ڕەخنەگرتن ناوەو دەڵێ: (( النقد الذاتي والنقد البناء ضمان لسلامة البناء الوطني)) هەروەها لە ماددەی (٤٩)دا جارێکیتر بەشێوەیەکی زمنی جەختی لەسەرکردۆتەوەو دەڵێ: (( تكفل الدولة للمواطنين حرية البحث العلمي والابداع الادبي والفني والثقافي )).

هەروەکو لەسەرەوە ئاماژەمان پێی کرد، بۆیە ڕەخنەگرتن بەماف دانراوە تاکو لە ڕێگای ئەوەوە خزمەتی بەرژەوەندی گشتی بکەین. جا لەبەرئەوەی ڕەخنەگرتن لە کردەوەو بیروڕای کەسانیتر، ڕەخنەگرتنە لە خودی کەسانی خاوەنی ئەو کردەوەو بیروڕایانە، بۆیە. ئەمە خۆیلەخۆیدا دەستدرێژیکردنە بۆسەر ناوونابوبانگو ئیعتباریان، وێڕای ئەوەی هەرخۆی ڕەخنە جۆرێك لە جۆرەکانی ئاتەوتەشەرو جوێن لەخۆ دەگرێت[132].

بەڵام سەرەڕای ئەمەش، بەرژەوەندی کۆمەڵ وادەخوازێت کە دان بە ئازادی بیروڕادەربڕین دابنرێت بە مەبەستی بەدیهێنانی بەرژەوەندی گشتیو پێشخستنی کۆمەڵ لە ڕێگای ئۆزینەوەو داهێناندا کە لە ڕێگای ڕەخنەگرتنی بنیاتنەرو بابەتیانەوە دێتەدی. لەم حاڵەتەشدا، دەبێ بابەندی دوو بنچینە ببین، یەکەمیان بەدیهێنانی بەرژەوەندی تاکەکەسە. هی دووەمیشیان بەدیهێنانی بەرژەوەندی کۆمەڵە. جا لەبەرئەوەی بەرژەوەندی کۆمەڵ لەپێشترە، بۆیە دەیخەینە پێش بەرژەوەندی تاکەکەسەوە[133].

یاسای سزادانی عێراقی ساڵی ١٩٦٩ لە ماددەی (٤١)دا بۆ ڕێگادان بە ڕەخنەی جوێن ئامێز، پرنسیپێکی گشتی داناوەو دەڵێ: (( ئەگەرهاتوو کردەوەکە لە ئاکامی بەکارهێنانی مافێك کە یاسا دانیپێدانابێت ڕوویدات بە تاوان دانانرێت ))[134]

کەواتە مافی ڕەخنەگرتن ڕێگادەدات بە بەکارهێنانی ئەو دەستەواژانەی کە جوێنیان لەخۆ گرتووە ئەگەرهاتوو ئەو مەرجانەی تێدابوو

---

١٣٢ - د. عبدالحميد الشواربي ، جرائم الصحافة والنشر، سەرچاوەی پێشوو، ل٩٧.

١٣٣ - د. عبدالحميد الشواربي ، جرائم الصحافة والنشر، سەرچاوەی پێشوو، ل٩٧.

١٣٤ - جێی سەرنجە، یاسای سزادانی میسری لە ماددەی (٦٠)دا هەمان پرنسیپی بۆ ڕێگادانی ڕەخنەی ئاتەوتەشەرئامێز داناوەو دەڵێ: (( لاتسري احكام قانون العقوبات على كل فعل ارتكب بنية سليمة عملا بحق مقرر بمقتضى الشريعة )).

کە مافی ڕەخنەگرتنی لەسەر بنیاتنراوە. جا لەسەر ئەو بنەمایە نەگەری ئەوە دەکرێ ڕەخنەکە فەرمانێکی کۆمەلایەتی بینیوە[135].

دادگای پیاچوونەوەی میسری لە حوکمێکیدا دانی بەم مافە ناوەو بە هۆیەکی داناوە لە هۆیەکانی ڕێگادان بە جوێن‌و لەمبارەیەوە دەڵێ: ((ئەو وتارانەی کە تاوانیان کەوتۆتەوە، لێکۆڵینەوەیان لە دەسەڵاتی دادگادایە، تاکو واتاو ئامانجی دەستەواژەکان تێبگات، بۆئەوەی بتوانێ وەسفێکی یاساییان بکات، ئایا ڕەخنەیەکی ڕێگاپێدراوە یا جوێنێکی یاساغکراوە))[136]. هەروەها لە حوکمێکیدا پێناسەی ڕەخنەی ڕێگاپێدراوی کردووەو دەڵێ: ((ڕەخنەی ڕێگاپێدراو بریتییە لە دەربڕینی بیروڕا لەبارەی فەرمانێك یان کارێکەوە بەبێ ئەوەی بەمەبەستی ناوزڕاندن‌و دەستدرێژی بۆسەر خاوەنی ئەو فەرمانە یان ئەو کارەی تیایێت. ئەگەرهاتوو ڕەخنەکە ئەو سنوورەی بەزاند دەبێ خاوەنەکەی سزابدرێت چونکە، بەگوێرەی حاڵەتەکان، تاوانی جوێنپێدان‌و ئابڕووبەرینی ئەنجام داوە ))[137]

لەم پێناسەیەی سەرەوەدا بۆمان دەردەکەوێ، دەبێ ئەم مەرجانەی خوارەوە لە ڕەخنەدا هەبن تاکو بە ڕەخنەی ڕێگاپێدراو دابنرێت:

ت- دەبێ ئەو ڕووداوەی ڕەخنەی لێگیراوە، ڕووداوێکی ڕاستەقینەبێت، یانیش ڕەخنەگر وابزانێت ڕووداوێکی ڕاستەقینەیە

---

١٣٥ - د. محمود نجيب حسني ، شرح قانون العقوبات – القسم الخاص – جرائم الاعتداء على الاشخاص، سەرچاوەی پێشوو، ل٦٦٧.

١٣٦ - د. محمود نجيب حسني ، شرح قانون العقوبات – القسم الخاص – جرائم الاعتداء على الاشخاص، سەرچاوەی پێشوو، ل٦٦٧.

١٣٧ - ( محكمة النقض المصرية، جلسة ١٩٣٨/١/١٠ رقم ٢٤٨ سنة ٨ ق ) بڕوانە (د. عبدالحميد الشواربي) جريمة القذف والسب في ضوء القضاء والفقه، سەرچاوەی پێشوو، ل١٥٨. هەروەها لطيفة حميد محمد، جرائم النشر في التشريع العراقي ، رسالة مقدمة الى كلية القانون جامعة بغداد كجزء من متطلبات نيل شهادة الدكتوراه في القانون الجنائي لعام ١٩٩٩، ل١٤١.

واتە نابێ ڕووداوەکە بەدرۆ هەڵبەسترابێت یان شێواو بێت. هەروەها دەبێ ڕەخنەکەی ڕەخنەگر ئاراستەی ڕووداوەکە بکات نەک خاوەنی ڕووداوەکە تەنها لەو حاڵەتەدا نەبێت ئەگەرهاتوو سروشتی ڕووداوەکە وابخوازێت. بەڵام ئەگەرهاتوو هەندێ ڕووداوی لەخۆیەوە هەڵبەست یان هەندێ ڕووداوی ڕاستەقینەی شێواند یان ڕووداوەکانی بەجۆرێکی وا لێکداوە کە دووربێت لە دەسپاکیو بووە مایەی چەواشەکردنی خوێنەرو دووربێت لە بابەتیاتەو بێلایەنی، یان ڕایگشتی چەواشە بکات، دەکەوێتەبەر لێپرسینەوەی یاساییەوە[١٣٨].

شایەنی ئاماژەبۆکردنە. ئەو دەستەواژانەی کە ڕەخنەگر بڵاویان دەکاتەوە چ هی خۆی بێت یان هی کەسانیتر بێت، وەکویەکە، چونکە دووبارە بڵاوکردنەوەی نووسینێك کە تاوانی لەخۆگرتبێت. وەکو بڵاوکردنەوەیەکی سەرلەنوێیە. بۆیە هیچ کەسێك بۆی نیە بۆ خۆدزینەوە لە بەرپرسیارێتی یاسایی پاساو بەوە بێنێتەوە گوایە ئەو دەستەواژانەی کە لەناو نووسینەکەدا هاتوون، پێشتر لە ڕۆژنامەیەکیتردا بڵاوکراوەتەوە. چونکە ئەوکەسەی نووسینێك لە ڕۆژنامەیەك وەردەگرێتو دووبارە بڵاویدەکاتەوە، پێویستە بەر لەوەی دووبارە بڵاویبکاتەوە یان ڕەخنەی لێ بگرێت، لێی بکۆڵێتەوە ئایا ئەو نووسینە بوونی هەیە یان نا؟ هەروەها ئایا دەسکاری کراوە یان نا؟[١٣٩].

هەروەها لەوانەیە ئەو ڕووداوەی ڕەخنەی لێگیراوە، ڕووداوێکی ڕاستەقینە نەبێت، بەڵام ئەگەرهاتوو ڕەخنەگر ئەوەی سەلاند کە لەو

---

١٣٨ - للمستشار معوض عبد التواب، القذف والسب والبلاغ الكاذب، سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٢.

١٣٩ - محكمة النقض المصرية، الطعن رقم ١٠٢٧ لسنة ٣٠ ق جلسة ٢٠/١٢/١٩٦٠ س١١ ص٩٢٩ بڕوانە ( للمستشار معوض عبد التواب ) القذف والسب والبلاغ الكاذب، سەرچاوەی پێشوو ل ١٢٢.

باوەڕدابوو کە ڕووداوێکی ڕاستەقینەیەو نەیزانیوە بەدرۆ هەڵبەستراوە، دەکرێ لەسەر بنەمای "نیازپاکی" بەبێ تاوان دابندرێت[١٤٠].

پ دەبێ ڕووداوەکە بایەخێکی کۆمەڵایەتی هەبێت

بۆ مافی ڕەخنەگرتن وەك مافێکی یاسایی ئەوەندە بەس نیە ڕەخنەکە ئاراستەی ڕووداوێکی ڕاستەقینە کرابێت، بەڵکو دەبێ ئەو ڕووداوە بایەخێکی کۆمەڵایەتی هەبێت. ئەمە مەرجێکە لە مەرجەکانی ڕەخنەی بنیاتنەر، بەڵام ئەگەر هاتوو ڕووداوەکە بایەخە کۆمەڵایەتیەکەی لەدەستدا، ئەوکاتە هیچ پاساوێك بۆ ڕەخنەلێگرتنی نامێنێ، چونکە ڕەخنە فەرمانێکی کۆمەڵایەتی هەیە، ئامرازێك نیە بۆ تانەوتەشەرو جوێندان بە خەلکی[١٤١].

کەواتە، ڕەخنەی بنیاتنەر، ئەو ڕەخنەیەیە کە ئاراستەی ئەو ڕووداوانە دەکرێ کە جەماوەر بایەخیان پێ دەدات، بەڵام ئەگەر هاتوو، ڕووداوەکە ئەو بایەخەی نەبوو، ئەوکاتە ڕەخنەکەش ئەم سیفەتە لەدەست دەدات. جا ناکرێ لەبەناوی ڕەخنەوە دەستدرێژی بکرێتە سەر ژیانی تایبەتی خەڵکی مەگەر پەیوەندی هەبێت بە کاروباری ژیانی گشتییەوە. لەم حاڵەتەشدا نابێ ڕەخنەکە لەم سنوورە بچێتە دەرەوە[١٤٢].

شایەنی باسە، کۆمەڵ هیچ سوودێك لەوە وەرناگرێت، ڕەخنەگر خۆی لە قەرەی ژیانی تایبەتی کەسێك بدات، بەڵکو بەپێچەوانەوە نیگەران دەبێ،

---

١٤٠ - د. عبدالحميد الشواربي : جرائم الصحافة والنشر، سەرچاوەی پێشوو، ل٩٢.

١٤١ طارق احمد فتحي سرور، الحماية الجنائية لأسرار الأفراد في مواجهة النشر، منشورات دار النهضة العربية، القاهرة، ١٩٩١، ل١٦١.

١٤٢ - طارق احمد فتحي سرور، الحماية الجنائية لأسرار الأفراد في مواجهة النشر، سەرچاوەی پێشوو، ل١٦١.

چونکە ڕەوشتی کۆمەڵایەتی ڕێگانادات دەستدرێژی بکرێتە سەر ژیانی تایبەتی کەسێك و خەڵکی لێ ئاگادار بکرێتەوەو بیروڕای لەسەر ئاڵوگۆڕ بکرێت[١٤٣].

بێگومان، هەر ڕووداوێك پەیوەندی بە بەرژەوەندی گشتییەوە هەبێت، جێگای بایەخی کۆمەڵ دەبێت و دەکرێ ڕەخنەی لێ بگیرێت. لەم ڕووەوە دادگای پیاچوونەوەی میسری لە بڕیارێکیدا دەڵێ: (( ڕەخنەی ڕێگاپێدراو بریتییە لە دەربڕینی بیروڕا لەبارەی فەرمانێکەوە یان کارێکەوە بەبێ ئەوەی دەستدرێژی بکرێتەسەر خاوەنی ئەو فەرمانە یان ئەو کارە بە مەبەستی ناوزڕاندنی. دادگا لە حوکمەکەیدا ئەمەی لەبەرچاوی خۆی نەگرتووە. چونکە ڕەخنەکە ئاراستەی ڕووداوێکی گشتی کراوە کە بریتییە لە سیاسەتی داوودەرمانی پزیشکی لە وڵاتدا. کە ئەمەش کێشەیەکی گشتییەو جێگای بایەخی جەماوەرە. جا لەبەرئەوەی دەستەواژەی وتارەکە لەگەڵ باروودۆخی ئێستا دەگونجێت و مەبەستیشی بەرژەوەندی گشتییەو ڕەخنەگر مەبەستی نەبووە ناوناتکەیەوەو جوێن بە کەسێکی دیاریکراو بدات، بۆیە ئەمە بە ڕەخنەی ڕێگاپێدراو دادەنرێت چونکە پەیوەندی هەیە بە ئازادی بیروڕاو یاسا کەفالەتی کردووە))[١٤٤].

ح. بەکارهێنانی دەستەواژەی گونجاو

ڕەخنەی بنیاتنەرو بابەتیانە ئەو ڕەخنەیەیە کە ڕەخنەگر تیایدا بۆ پێکانی ئامانجەکەی دەستەواژەی گونجاو بەکاردەهێنێت و بەپێی توانایش لە دەستەواژەی توندوتیژ دوور بکەوێتەوەو لەپەنای ڕەخنەوە هەستی کەس بریندار نەکات و تیروتوانجیان تێنەگرێت.

---

١٤٣ - المستشار معوض عبد التواب: القذف والسب والبلاغ الكاذب، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢٤.

١٤٤ المستشار معوض عبد التواب ، القذف والسب والبلاغ الكاذب، سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٥.

جا پێوەری دەستەواژەی گونجاو بریتییە لە پێویستێتی ئەم دەستەواژەیە بۆ گوزارشتکردن لە بیروڕای نووسەرەکەی بۆ هێنانەدی ئەو واتایەی کە لە نووسینەکەیدا مەمەستیەتی[١٤٥].

جێی سەرنجە، " گونجاوێتی دەستەواژە " مەسەلەیەکی ڕێژەییەو پەستراوەتەوە بە جۆرو بارودۆخی ئەو ڕووداوەی کە ڕەخنەکەی ئاراستە دەکرێت و بەپێی ئەو بارودۆخە گونجاوێتی نێوان دەستەواژەو ئەو بیروڕایەی کە تەعلیقی لێدەدرێ هەڵدەسەنگێندرێت[١٤٦].

دادگای فەرەنسی لە ساڵی ١٩٩٢ ئەو ڕۆژنامەنووسانەی لە تاوانی تانەوتەشەرو جوێندانی بەئاشکرا بەخشی بۆ ئەو تانەوتەشەرو جوێنانەی کە دابوویانەپاڵ سیاسەتمەدارێك گوایە: (( مرۆڤێکی هەڵپەرستەو بەپێی بارودۆخ بەرگی خۆی دەگۆڕێت و لەگەڵ خودی خۆی دژوارەو هیچ نرخێك بۆ باوەڕە ڕاستەقینەکەی خۆی دانانێت)) دادگای ناوبراو دووپاتی کردۆتەوە کە ئەو دەستەواژانەی کە لەم وتارەدا بەکارهاتوونە، سنووری مافی ڕۆژنامەنووسیان لە ڕەخنەگرتنی ڕەفتاری گشتی و بەرنامەی سیاسەتمەدار بەتایبەتی لە کاتی هەڵبژاردندا نەبەزاندووە[١٤٧].

ز- دەبێ ڕەخنەگر نیازی پاکە بێت

بۆئەوەی ڕەخنە، ڕەخنەیەکی ڕەوابێت و ڕێگای پێبدرێت. دەبێ ڕەخنەگر لە ڕەخنەکەیدا نیازی پاك بێت، ئەمەش بە بوونی ئەم دوو مەرجانەی خوارەوە دێتەدی:

---

١٤٥ - طارق احمد فتحي سرور، الحماية الجنائية لأسرار الأفراد في مواجهة النشر، سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٥.

١٤٦ لطيفة حميد محمد: جرائم النشر في التشريع العراقي سەرچاوەی پێشوو، ل١١٥.

١٤٧ - لطيفة حميد محمد: جرائم النشر في التشريع العراقي سەرچاوەی پێشوو، ل١١٥.

**١- دەبێ ڕەخنەگر لە ڕەخنەکەیدا ئامانجی خزمەتکردنی بەرژەوەندی گشتی بێت**

لەرێگای ئەم مەرجەوە ئەو مەبەستە دێتەدی کە لە پێناویدا دان بە مافی رەخنەگرتن نراوە کە بریتییە لە خزمەتکردنی بەرژەوەندی گشتی لەرێگای گوزارشتکردن لە بیروڕایەکی بنیاتنەر. کە سوودی بۆ کۆمەڵ هەبێت. جا چ بۆ کاری چاك ئامۆژگاری بکرێت یانیش بۆ دوورکەوتنەوە لەکاری خراپ وریا بکرێتەوە[١٤٨].

**٢- دەبێ ڕەخنەگر لە ڕەخنەکەیدا باوەڕی بە ڕاستی ئەو ڕەخنەیە بکات کە گرتوویەتی**

واتە دەبێ ڕەخنەگر ناخەوە باوەڕی بە ڕاستی‌و دروستی ئەو ڕایە بکات کە دەریدەبڕێت. هەڵبەتە ئەمەش لەو دەستەواژانەدا دەردەکەون کە رەخنەگر بەکاری هێناون، هەروەها لەو ئامانجەشدا بەدەردەکەوێ کە ڕەخنەگر مەبەستی بووە.

لە بنەڕەتدا گریمانەدەکرێ کە ڕەخنەگر ڕاستگۆیەو نیازیشی پاکە لە ڕەخنەکەیدا، بەڵام ئەگەرهاتوو ئەو دەستەواژانەی کە بەکاری هێنابوون، دەستەواژەی توندوتیژ بوون یان بابەتی نەبوون یانیش ڕەخنەگر خۆی لەو باوەڕەدابووە کە ئەو بیروڕایەی دەریدەبڕێت ڕاست نیە. ئەوە مانای ئەوەیە ڕەخنەگر نیازخراپ بووە لە ڕەخنەکەیدا. لەم حاڵەتەشدا. ئەرکی سەلماندنی نیازخراپیەکەی دەکەوێتە ئەستۆی ئەوکەسەی کە تۆمەتباری دەکات[١٤٩].

---

١٤٨ - طارق احمد فتحي سرور، الحماية الجنائية لأسرار الأفراد في مواجهة النشر، سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٧.

١٤٩ د. محمود نجيب حسني : شرح قانون العقوبات – القسم الخاص – جرائم الاعتداء على الاشخاص، سەرچاوەی پێشوو، ل٦٤٩.

گرنگترین گەرینە (قرینة) بۆ سەلماندنی نیازخراپی ڕەخنەگر، توندوتیژیو ناشیاوی ئەو دەستەواژانەیە کە لە ڕەخنەکەدا بەکارهاتوون بێ ئەوەی پێویست بێت. بەتایبەتی ئەگونجانیان لەگەڵ ئامانجی ڕەخنەکە، هەرچەندە مەرجیش نیە تەنها لەڕێگای ئەو دەستەواژانەی کە لە وتارەکەدا بەکارهاتوون، نیازخراپی ڕەخنەگرمان بۆ دەربکەوێ، بەڵکو دەکرێ بەهەر ڕێگایەکیتر بگەینە ئەم مەبەستە. لەوانە هەوڵدانی ڕەخنەگر بۆ وەدەستهێنانی سوودێك یان داراییەك بەرامبەر ڕاگرتنی هەڵمەتی ڕەخنەگرتنەکە یان بوونی ناکۆکی لەنێوان ڕەخنەگرو ئەوکەسەی ڕەخنەکەی ئاراستەکراوە[150].

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، نیازپاکی هۆیەکی گشتیە لە هۆیەکانی ڕێگادان بە هەموو تاوانێك لەوانە تاوانی جوێنپێدان. ئەگەرهاتوو ئەنجامدەر نیازی پاکبووبێت یان لەو باوەڕە دابووبێت ئەو کردارەی کە ئەنجامی دەدات ڕەوایە. هەروەها بۆ ئەم مەبەستە پشتی بە هەندێك پاساوی ماقوڵ بەستبێت[151].

---

١٥٠ - د. محمود نجيب حسني ، شرح قانون العقوبات – القسم الخاص – جرائم الاعتداء على الاشخاص، سەرچاوەی پێشوو، ل٦٤٠، هەروەها طارق احمد فتحي سرور، الحماية الجنائية لأسرار الأفراد في مواجهة النشر، سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٩.

١٥١ - د. عبدالحميد الشواربي ، جرائم الصحافة والنشر، سەرچاوەی پێشوو، ل٩٢.

## کۆتایی:

**لە کۆتاییدا ، بۆمان دەردەکەوێ:**

- هەرچەند تاوانی جوێنپێدان یەکێکە لەو تاوانانەی کە لە بنەڕەتدا بە تاوان داندراوەو گشت ڕێبەڵەکانیشی هەنەو یاساش سزای بۆ داناوە. چونکە دەبێتە مایەی ناووناوبانگ زڕاندن و لەکەدارکردنی شەرەفو کەرامەتی ئەوکەسەی کە تاوانەکەی دەرهەق دەکرێ. بەڵام سەرەڕای ئەمە ئەگەر ڕوویدا، لەبەر هەندێك ئیعتبار، لە هەندێك حاڵەتی دیاریکراودا، بە مەبەستی ئومارەسەکردنی ئەو مافانەی کە یاسا دانی پێداناوە جوێنپێدانەکە ڕێگای پێ دەدرێت و ئەنجامدەری جوێنەکەش لە سزا دەبەخشرێت.
- هەرکاتێك هۆیەك لە هۆیەکانی ڕێگاپێدانی جوێنپێدانەکەو مەرجەکانی هەبوون، ئاکامێکی ڕاستەوخۆی بەسەر ڕێگاپێدانی ئەو جوێنپێدانەوە دەبێت.
- یاسای سزادانی عێراقی لە ماددەی (٤١)دا بۆ ڕێگادان بە جوێن، پرنسیپێکی گشتی داناوەو لەبەر ڕۆشنایی ئەوەوە هەندێك حاڵەتی لە حاڵەتەکانی تاوانی ڕێگاپێدراو بە نموونە هێناوەتەوە. کە بەشێکن لەو حاڵەتانەی سەرچاوە گشتییەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ دەقی ماددەی ناوبراوو دەگرێ گەلێك جیبەجێکردنی دیکەی لێ هەڵێنجین. لەوانە ڕەخنەی ڕێگاپێدراو (النقد المباح).
- حەسانەی پەرلەمانی، هۆیەکە لە هۆیەکانی ڕێگادان بە تاوانی جوێنپێدان و ئەم حەسانەیەش حەسانەیەکی هەمیشەییە،و پەرلەمانتار دوای کۆتاییهاتنی ماوەی پەرلەمانێتییەکەشی، لەسەر تاوانی جوێنپێدان دادگایی ناکرێت، ئەگەرهاتوو تاوانەکەی لەماوەی ئەندام بوونی لە پەرلەماندا ئەنجام دابێت.
- حەسانەی پەرلەمانی، تەنها پەرلەمانتاران دەگرێتەوە، ئەو فەرمانبەرو کارمەندانە ناگرێتەوە کە لە پەرلەماندا کاردەکەن.
- نابێ لەبەمفای ڕەخنەوە دەستدرێژی بکرێتە سەر ژیانی تایبەتی خەڵکی مەگەر پەیوەندی هەبێت بە کاروباری ژیانی گشتییەوە. لەم حاڵەتەشدا نابێ ڕەخنەکە لەم سنوورە بچێتە دەرەوە. ئەگینا ڕێگای پێ نادرێت.

- یاسای سزادانی عێراقی ڕاشکاوانە ڕێگای بەو جوێنە نەداوە کە پەیوەندیی هەیە بەو تانەوتەشەرەی کە ئاراستەی فەرمانبەرێك یا ئەوکەسانەی کە لە حوکمی ئەودانە دەکرێ، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ. ئەگەر هاتوو، ئەو جوێنەی بە فەرمانبەرێك یا ئەوکەسانەی کە لە حوکمی ئەودانە درا، ئەگەر پەیوەندی بەو تانەوتەشەرەوە هەبوو، کە لەلایەن هەمان تاوانبارەوە ئاراستەی هەمان کەس کرابوو، ڕێگای پێ نەدرێت، مادام بەبۆنەی ئاراستەکردنی تانەوتەشەرەکەوە ئاراستەی ئەوکەسە کراوەو بۆتە بەشێك لەو ڕووداوەی دراوەتە پاڵی. ئەگینا فەرمانبەران و ئەوکەسانەی کە لە حوکمی ئەودانە لە ڕەخنەگرتن و تانەوتەشەری ڕێگاپێدراو کە بۆ بەرژەوەندی گشتی یاسا دانی پێداناوە، ڕزگاریان دەبێت.

## سەرچاوەكان

**كتێبەكان :**


- المستشار معوض عبد التواب: القذف والسب والبلاغ الكاذب، منشورات دار المطبوعات الجامعية، اسكندرية، ١٩٨٨ .
- د. محمود نجيب حسني : شرح قانون العقوبات – القسم الخاص – جرائم الأعتداء على الاشخاص، منشورات دار النهضة العربية، مطبعة جامعة القاهرةو الكتاب الجامعي، القاهرة، ١٩٧٨ .
- المستشار مصطفى مجدي هرجة: التعليق على قانون العقوبات في ضوء الفقه والقضاء – القسم الخاص، الكتاب الثالث، ط/١، منشورات منشأة المعارف، اسكندرية، ١٩٨٨.
- احمد امين: شرح قانون العقوبات – القسم الخاص، ط/٣، منشورات مكتبة النهضة، بيروت-بغداد، بلأسنة النشر.
- د. عبدالحميد الشواربي: جريمة القذف والسب في ضوء القضاء والفقه، منشورات دار المطبوعات الجديدة، اسكندرية، ١٩٨٥.
- د. ابراهيم الداقوقي: قانون الاعلام، منشورات جامعة بغداد، مطبعة وزارة الاوقاف والشؤون الدينية، بغداد، ١٩٨٦.
- لطيفة حميد محمد: جرائم النشر في التشريع العراقي ، رسالة مقدمة الى كلية القانون جامعة بغداد كجزء من متطلبات نيل شهادة الدكتوراه في القانون الجنائي لعام ١٩٩٩.
- طارق احمد فتحي سرور: الحماية الجنائية لأسرار الأفراد في مواجهة النشر، منشورات دار النهضة العربية، القاهرة، ١٩٩١.
- شريف كامل : الجرائم الصحفية، ج/٢، شركة دار الاشعاع للطباعة، القاهرة، ١٩٨٦.
- كمال سعدي مصطفى: حق الملكية الادبية والفنية في القانون العراقي والمقارن، رسالة مقدمة الى كلية القانونوالسياسة ، جامعة صلاح الدين كجزء من متطلبات نيل شهادة الماجستير في القانون لعام ١٩٩٦.

- مصطفى مجدي هرجة: التعليق على قانون العقوبات في ضوء الفقه والقضاء – القسم الخاص، الكتاب الثالث، ط/١، منشورات منشأة المعارف بالأسكندرية، ١٩٨٨.
- د.عبدالله اسماعيل البستاني : حرية الصحافة في العراق، ط/١، منشورات جمعية بيروت الامة، مطبعة الرابطة، بغداد.
- د.لطيفة حميد محمد : جرائم النشر في التشريع العراقي، رسالة مقدمة الى كلية القانون ، جامعة بغداد كجزء من متطلبات نيل شهادة الدكتوراهفي القانون الجنائيلعام ١٩٩٩.
- عادل بطرس ؛ قانون الاعلام، الجزء الثالث، مطابع الفضالي، بيروت-لبنان، ١٩٩٥.
- د.علي حسين الخلف و سلطان عبدالقادر الشاوي ؛ المبادىء العامة في قانون العقوبات، مطبعة الرسالة، الكويت، ١٩٨٢.
- د.فخري عبدالرزاق الحديثي : شرح قانون العقوبات، القسم العام، مطبعة اوفسيت الزمان، بغداد، ١٩٩٢.
- د.محمد زكي ابو عامر : قانون العقوبات اللبناني – القسم العام، الدار الجامعية للطباعة والنشر، بيروت، ١٩٨١.
- د. مصطفى ابراهيم الزلمي : المسؤولية الجنائية في الشريعة الاسلامية و مقارنة بالقانون، ج/١، مطبعة اسعد، بغداد، ١٩٨٢.
- د.احمد الاشهب : المسؤولية الجنائية في الشريعة الاسلامية والقوانين الوضعية، منشورات جمعية الدعوة الاسلامية العالمية، ط/١، بنغازي، ١٩٩٤.
- د.عبدالله اسماعيل البستاني ؛ حرية الصحافة، سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٥، و د.محمد محيالدين عوض ؛ العلانية في قانون العقوبات، مطبعة النصر، القاهرة، ١٩٥٥.
- ميثم حنظل شريف ؛ التنظيم الدستوري والقانوني لحرية الصحافة، رسالة مقدمة الى كلية القانون جامعة بغداد كجزء من متطلبات نيل شهادة الماجستير في القانون لعام ١٩٩٩، النسخة المعدة للمناقشة.
- جون . ار . بيتنر : مقدمة في الاتصال الجماهيري، ترجمة مركز الكتب الاردني، عمان، ١٩٩٠.

- د. عبدالحميد الشواربي : جريمة القذف والسب في ضوء القضاء والفقه، منشورات دار المطبوعات الجديدة بالاسكندرية، ١٩٨٥.
- ابراهيم المشاهدي: المبادئ القانونية في قضاء محكمة التمييز، القسم الجنائي، مطبعة الجاحظ، بغداد، ١٩٩٠.
- د. جمال الدين العطيفي: الأساس القانوني لاباحة القذف في حالة نشر اخبار الجرائم والتحقيقات الجنائية، مجلة القانون والأقتصاد، العدد الثالث، السنة التاسعة والثلاثون، سبتمبر/ ١٩٦٩، مطبعة جامعة القاهرة.
- د. سليمان جازع الشمري: الصحافة والقانون، منشورات الدار الدولية للنشر والتوزيع، القاهرة، مصر، بلاسنة النشر.
- د. عبدالحميد الشواربي : جرائم الصحافة والنشر، منشأة المعاوف بالاسكندرية، ط/٣، ١٩٧٧.
- طارق احمد فتحي سرور: الحماية الجنائية لأسرار الأفراد في مواجهة النشر، منشورات دار النهضة العربية، القاهرة، ١٩٩١.

ياساو رێساو دەستوورەكان :

- الدستور العراقي لسنة ١٩٧٠ المعدل.
- قانون العقوبات العراقي المرقم (١١١) لعام ١٩٦٩ المعدل.
- قانون العقوبات المصري رقم (٥٧) لسنة ١٩٢٨ المعدل.

بەڵگەنامەكان:

- جاڕی گەردوونیی مافی مرۆڤ، ئەنیستیتۆی كورد لە پاریس، فدراسیۆنی ناونەتەوەیی مافی مرۆڤ، فۆنداسیۆنی دانیل میتران، جوڵانەوەی كرێكارانی نەرویژی، پاریس، ١٩٩٣.
- رۆژنامەی "الوقائع العراقية" ژمارە (٣٥٤٠) لە ١٢/٥/١٩٩٤.



## دانەر لە چەند دێڕێکدا:

- لە ساڵی ١٩٥٦ لە شاری هەولێر هاتۆتە سەر شانۆی ژیان.
- لە ساڵی ١٩٩٤ بەشداری کردووە لە دامەزراندنی کۆمەڵەی عێراقی بۆ مافەکانی مرۆڤ ئەوکاتە بارەگاکەی لە دیمەشقی پایتەختی سوریا بوو بە شێوەیەکی کاتی.
- لە ساڵی ١٩٨٨/١٩٨٩ کۆلێژی یاسای لە زانکۆی سەلاحەددین تەواوکردووەو بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لە یاسا وەرگرتووە.
- لە ١٩٩٦/٥/٢١ بڕوانامەی ماستەری لە یاسا لە نامەی "حق الملكية الأدبية والفنية في القانون العراقي والمقارن" لە کۆلێژی یاساو ڕامیاری لە زانکۆی سەلاحەددین وەرگرتووە.
- لە ٢٠٠٣/٧/٧ بڕوانامەی دکتۆرای لە یاسا لە نامەی "چوارچێوەی یاسایی ئازادی ڕۆژنامەگەری لە کوردستانی عێراقدا" لە کۆلێژی یاساو ڕامیاری لە زانکۆی سەلاحەددین وەرگرتووە.
- بە بۆنەی (١٠٦) ساڵەی ڕۆژنامەگەریی کوردی لە ڕۆژی ٢٠٠٤/٤/٢٢ وەك نووسەرێك بۆ ئەو دەیان ساڵەی کە لەم بوارەدا خزمەتی کردووە لەلایەن وەزارەتی ڕۆشنبیری هەرێمی کوردستانەوە لەگەڵ کۆمەڵێك نووسەریتر ڕێزی لێ نراوەو مووچەیەکی مانگانەی بە بڕی (٢١٠٠٠٠) دینار بە درێژایی ژیان بۆ بڕاوەتەوە.

### بێ لە وتارو توێژینەوە زانستییەکان، ئەم کتێبە چاپکراوانەی خوارەوەی هەیە:

- شەش کورتەچیرۆکی کوردی — هاوبەش. چاپخانەی شارەوانی ١٩٧٦
- ون بوون — چیرۆك. چاپخانەی ڕۆشنبیری ١٩٨٤
- دەرگا — چیرۆك. چاپخانەی زانکۆ ١٩٩٠
- سەعید زەبوٚکی لای خوٚمان — ڕۆمان. چاپخانەی ڕۆشنبیری ١٩٩٦
- چەمکی ماف — چاپی یەکەم + چاپی دووەم. چاپخانەی کریستال ١٩٩٨
- لێکدانەوەی یاسای بەکرێدان. چاپخانەی زانکۆ ١٩٩١
- چەمکی یاسا. چاپخانەی زانکۆ ١٩٩٩
- حقوق المؤلف. چاپخانەی کریستال ١٩٩٧
- یاساو ماف. چاپخانەی زانکۆ ١٩٩٨
- مافی دانەر — وەرگێڕان، هاوبەش. چاپخانەی زانکۆ ٢٠٠٠
- تڕحێو — چیرۆك. چاپخانەی زانکۆ ١٩٩٨
- دەسەڵاتی چوارەم. چاپخانەی ڕۆشنبیری ١٩٩٨
- هونەری منداڵان. چاپخانەی کریستال ١٩٩٨
- یاسای ڕۆژنامەگەری. چاپخانەی قەڵا ٢٠٠٣
- ئازادیی ڕۆژنامەگەری و ئەخلاقی پیشە. چاپخانەی منارە ٢٠٠٤

چاپخانەی منارە - هەولێر